# هیڤیا ماسیێ



وەرگێڕان ژ ئینگلیزی

**دیان جەمیل**




حکومەتا هەرێما کوردستانێ

وەزارەتا رەوشەنبیری و لاوان

رێڤەبەریا گشتی یا راگەهاندن و چاپ و بەلاڤکرنێ

رێڤەبەریا چاپ و بەلاڤکرنێ - دهۆك

---

- ناڤێ پەرتووکێ: هیڤییا ماسیێ
- نڤیسەر: Ethan Crownberry
- وەرگێران ژ ئینگلیزی: دیان جەمیل
- بابەت: چیرۆکێن زارۆکان
- تیپچنین: کاژین جەمیل
- دیزاینا ناڤەرۆکێ: بێوار محەمەد
- قەوارە: 26.5 سم × 18.5سم
- ژمارا لاپەران: 42
- تیراژ: 500
- چاپا ئێکێ 2013
- ژمارا سپاردنێ: **2219**

# هێڤییا ماسیێ

نڤێسین
**Ethan Crownberry**

وەرگێران ژ ئینگلیزی
**دیان جەمیل**

ل دەمەكى بەرى نۆكە د ژوورەكا تارى و بێهنتەنگ دا، ل كوژيێ وێ ژوورێ مێزەكا كەڤن و شكەستى و گەلەك تۆز گرتيبوو لێ هەبوو، ل سەر وێ مێزا كەڤن شويشەكا ئاڤێ هەبوو، د ناڤ وێ شويشا ئاڤێ دا ماسيەكا زێرييا بچويك مەلەڤانى دكرن. ماسيێ گازندە ژ بەختێ خۆ يێ رەش و ئەو ژيانا ئەو تێدا دژيت دكرن. هەر ژ ڤێ چەندێ ماسيا بچويك گەلەك هيڤى د دلێ خۆ دا دگۆتن و چيرۆكا مە دگەل هيڤيێن وێ دەست پێ دكەت.





خودانێ ماڵێ ئەڤ ماسیا ڕەنگ زێری و
جوان ژ بازاری کری بوو و کربوو دیاری بۆ
کچا خو ئەڤینێ ب هەلکەفتا دەرچوونا وێ
ژ پولا سیێ سەرەتایی، لێ مخابن خودانێ
ماڵێ ئەڤ ماسیە ب تنێ ژ بازاری کری بوو،
ئانکو ماسی یا ب تنێ بوو و چ هەڤال دگەل
نەبوون لەو ژی هەدارا وی نە د هات.

پشتی خودانێ ماڵێ ماسی ئینایە ماڵ، کرە د شیشەکا بچویک یا ئاڤێ دا و دانا سەر مێزەکێ د ناڤ ماڵدا. ماسی یا بتنێ بوو و جهێ وێ گەلەك یێ تەنگ بوو و نە دشیا ب ئازادی مەلەڤانیا بکەت و بهێت و بچیت لەو هەر زوی نیشانێن خەموکی و بێ ئومێدیێ ل سەر دێمێ وێ دیاربوون و هزرێن نەخوش د کرن.





ئەو شویشا ئاڤێ یا ماسی تێدا گەلەك یا بچویک بوو و ئاڤا تێدا ژی یا پاقژ نەبوو، هەر وەسا چ کەڤز و دار و گول و گیا و بەرێن نەخشاندی و ئاخ تێدا نەبوون، کو وەکی ژینگەها بنێ دەریایێ خویا بکەت. د سەر ڤێ چەندێ هەمیێ ڕا ماسی گەلەك یا برسیبوو و چ خوارن نەبوو بخۆت، لەو هێدی هێدی هەست ب لاوازیێ دکر.

ماسیێ پەڕێن خۆ ل شویشەی ددان و دگۆتێ تو گەلەکا بچویکی و جهێ من د ناڤ تەدا نینە. نەشێم مەلەڤانیا بکەم، نەشێم یاریان بکەم، چونکی من چ هەڤال نینن. نۆکە من زانی، کۆ ژیانا من چ بهایێ خۆ نینە و ئەز د ژیانێ دا ماسیەکا بەختڕەشم.





ماسيێ بەردەوام گازندە ژ حالێ خۆ دكرن، لێ مخابن كەس نەبوو گوهداريا وێ بكەت و خەمێن وێ ڤەرەڤينيت، چونكى كەس نەدهاتە د وێ ژوورا تارى و نەخۆش ڤە. ماسى گەلەك د ترسيا و هەست ب نەخۆشيێ دكر، هەر چەندە وێ گەلەك دكرە گرى و هەوار، لێ رۆندكێن وێ هشكبوون و كەس د هەوارا وێ نەهات.

دگەل ڤان نەخۆشیان هەمیان، ماسی هەر یا
بێ ئومێد نەبوو، ئینا سەرێ خۆ ژ شویشا ئاڤێ
ئینا دەر و ب دەنگەکێ بلند گۆت: ئەز ب چ
رەنگان دەستان نا داهێلم، خۆ رادەستی بەختێ
خۆ یێ ڕەش ناکەم، ئەز ماسیا زێڕیمە و من
جهەکێ خۆش دڤێت، من دڤێت ب ئازادی
بژیم و مەلەڤانیا ب ئازادی بکەم، ئەز پێدڤی
جهەکێ روهنم و من ئاڤەکا پاقژ و خوارن
دڤێت.





ئەز ماسیا زێریمە و دڤێت ل جهەکێ خۆش
بژیم"

دگەل گۆتنا ڤان پەیڤان، ماسی هەر یا بەردەوامبوو ل سەر نەڕازیبوون و گازندێن خۆ، بەردەوام دکرە هەوار، بەلکۆ کەسەك د هەوارا وێ بهێت و وێ ژ ڤی جهێ نەخۆش بینتە دەرێ.

چەند دەم د بۆری بێهنا ماسیێ تەنگتر لێ دهات و کەربێن وێ پتر ڤەدبوون، چونکی وێ دڤیا نۆکە ئەو د ناڤ دەریایەکێ دا بایە و دگەل هەڤالێن خۆ یاری و مەلەڤانی کریانە، نەکۆ د ناڤ ڤێ شویشا ئاڤێ یا بچویک دا هاتبایە زیندان کرن.

دگەل ڤان گازندان هەمیان ژی کەس د هەوارا ماسیا زێرین نەهات. کەسێ گوهـ ل دەنگێ وێ نەبوو، کەسێ نەدزانی ماسی یا د رەوشەکا گەلەك نەخۆش و ئالۆز دا و پێدڤی ب هاریکاریێ یە. د ڤی دەمی دا، بێدەنگیێ ئەو ژوورا ماسی تێڤە هەمی داگیرکربوو و تاریاتیێ ژی هەمی تشت ڤەشارتبوون.





ژ نیشکەکێڤە، رۆناهیەکا ب هێز هاتە د ژوورڤە، دەما ماسیێ بەرێ خۆ دایە وێ رۆناهیێ ئێکسەر چاڤێن خۆ گرتن و پەرێن خۆ دانانە بەر سەروچاڤێن خۆ، ماسیێ چ جارا رۆناهی یێن هۆسا بریسقدار و ب هێز نەدیتبوون، بەلکۆ ئەڤە ئێکەم جارە ئەو رۆناهیەکا هۆسا یا سەیر و ب ترس دبینیت.

ماسیێ پرسیارکر: توو کی ئەی خودانا ڤێ رۆناهیا مەزن و ب هێز؟ ئەز نەشێم چاڤێن خۆ ڤەکەم و تەماشەی تە بکەم، هیڤی دکەم پیچەکێ رۆناهیا خۆ کێم بکە دا بشێم چاڤێن خۆ ڤەکەم.

پشتی هینگێ رۆناهی پیچەك کێم بوو و ماسیێ چاڤێن خۆ ڤەکرن، ماسیێ ستێرەکا شۆخ و شەنگ و جوان دیت، کۆ ئەو رۆناهییە ژوێ ستێرێ دهات.





دەما ماسیێ ئەو ستێرا شۆخ و شەنگ دیتی،
گەلەك ب هاتنا وێ کەیفخۆشبوو، چونکی
وێ زانی کەسەك د هەوارا وێ هات و وێ
ناهێلیتە بتنێ. پشتی هینگێ ستێرێ ژی
گۆتە ماسیێ، ئەز ل دویڤ گازییێن تە یا
هاتیم و من گوهـ لێبوو، کۆ تە داخوازا
هاریکاریێ دکر، ڤێجا نۆکە کا تە چ هیڤی
هەنە بێژە، دێ هاریکاریا تە کەم و هیڤی یێن
تە بجهـ ئینم.

ماسیێ هزرێن خۆ کرن و گۆته ستێرێ: من گەلەك هیڤی و داخواز یێن هەین، نزانم دێ ژ کیرێ دەستپێکەم و ل کیرێ ب دووماهی ئینم.
پاشی گۆت:

هیڤییا من ئەوە، قەبارێ من مەزنتر لێ بهێت.

هیڤییا من ئەوە، ژ ڤێ شویشا بچویک دەرکەڤم.

هیڤییا من ئەوە، بچمە د ناڤ دەریایەکا مەزن دا و ب ئازادی مەلەڤانیان بکەم.

هیڤییا من ئەوە، من دوو شاپەڕ هەبن و بشێم بفرم.

هیڤییا من ئەوە، من چوار پێ هەبن و بشێم پێ برێڤە بچم.





ستێرا شۆخ و شەنگ گۆتە ماسیێ: دێ هەمی هیڤیێن تە بۆ تە بجهـ ئینم، لێ نۆکە بێژە من، ئەز ل دەستپێکێ کیژ هیڤیا تە بجهـ بینم، چونکی تە گەلەك هیڤی و خۆزی گۆتن؟

رۆیێن ماسیێ ژ شەرما دا سۆربوون، لێ پشتی هینگێ گرنژی و هزرێن خۆ کرن، ماسی مابوو د هزران دا و نەدزانی ل دەستپێکێ کیژ هیڤیا خۆ بێژیت، پیچەکا دی ژی هزرێن خۆ کرن و پاشی ب دەنگەکێ بلند گۆت:

من دڤێت، ئەز ببمە نەهەنگەکێ مەزن.

هیڤییا ماسیێ یا ئێکێ بجهـ هات و بوو نەهەنگەکێ مەزن. ئێدی ماسی وەکی بەرێ نەما، چونکی نۆکە یا بوویە نەهەنگەکێ گەلەك مەزن، درێژاهیا وی پێنجی مەترن و فرەهیا وی بیست مەترن.

نۆکە نەهەنگ گەلەك یێ کەیفخۆشە و یێ د ناڤ زەریایەکا مەزن دا و ب کەیفا دلێ خۆ یێ مەلەڤانیان دکەت، ژ کەیفادا بێهنا وێ ل چ ئەردان ناهێت و قەت بێهنا خۆ ناڤەدەت و یێ ب دەنگەکێ بلند گازی دکەت: ئازادی ... ئازادی... ئازادی چەندا خۆشە.





ل وی دەمێ نەهەنگ د گۆپیتکا خۆشیێ دا و مەلەڤانی دکرن، وی گوهـ ل دەنگێ پاپورەکێ بوو، نەهەنگی هێدی - هێدی خۆ نێزیکی سەر روویێ ئاڤێ کر، دیت ئەو پاپور یا نێچیرڤانایە و یێن هاتین نەهەنگێن زەریایێ بگرن و پاشی دا بەنە بازاری و بفرۆشن، دەما چاڤێ نێچیرڤانەکی ب نەهەنگی کەفتی، گازی کرە هەڤالێن خۆ و گۆتێ لەزێ بکەن ڤی نەهەنگێ مەزن بگرن و ژ دەستێ هەوە نەچیت.

هەر چەندە نەهەنگی هەول دا برەڤیت و خۆ قورتال بکەت، لێ پاپورا نێچیرڤانان گەلەك یا بلەزبوو و کەفتنە ب دویڤ نەهەنگی ڕا و بەردەوام تڤەنگ ددانانێ، دا بریندار بکەن، هەتا ل دووماهیێ شیاین نەهەنگی بریندار بکەن و پاشی تۆرەکا مەزن هاڤێتێ و نەهەنگ گرت.





نۆکە نەهەنگ یێ د ناڤ تۆرا نێچیرڤانان دا و گەلەك یێ خەمگینە و یێ دکەتە گری، چونکی دزانیت جارەکا دی ژیانا وی بەرەڤ نەخۆشیێ دچیت. لێ هەر د وی دەمی دا جارەکا دی ستێر د هەوارا وی هات، دا قورتال بکەت. نەهەنگی ئەڤ جارە گەلەك داخوازی ژ ستێرێ کرن وی بکەتە باڵندە، دا بلند بفڕیت و ژ مرۆڤان دویر بکەڤیت و دەستێ کەسێ نەگەهیتێ.

پشتی ستێرێ داخوازیا نەهەنگی بجهـ ئینایی و ئەڤ جارە کریە باڵندە، نۆکە یێ بەرەڤ ئەسمانی دفڕیت و هندی هێز هەی یێ بلند دفڕیت، داکۆ ئەڤ جارە ژ دەستێ نێچیرڤانان قورتال بیت. باڵندە نۆکە گەلەك یێ کەیفخۆشە ژبەر دیتنا وان دیمەنێن جوان و سەرنج ڕاکێشێن ئەو ل سەر ئەردی دبینیت، چونکی نۆکە ئەو یێ ژ چیایان ژی بلندتر لێ هاتی، لێ پشتی گەلەك فڕی نۆکە یێ هەست ب وەستیان و برسیبوونێ دکەت، لەو یێ بۆ خۆ ل خوارنەکێ دگەڕیت.





ژ نیشکەکێڤە باڵندەی ماڵەك دیت، هندەك گەنم و نان یێ دانایە بەر پەنجەرکێ، ل دەستپێکێ باڵندەی هزر کر خودانێن ڤێ مالێ گەلەك د دلۆڤانن و حەز ژ خودانکرنا گیانەوەران دکەن، ب تایبەت ژی یا باڵندەیان، لەو وان ئەڤ خوارنە بۆ وان یا دانایە بەر پەنجەرکێ.

باڵندەی بێ دوو دلی خۆ نێزیکی وێ مالێ کر، دا بچیت خوارنێ بخۆت، چونکی گەلەك یێ برسیبوو، لێ مخابن تشتێ وی هزر لێ نەکری، د ژوورڤە نێچیرڤانەکی بەرێ تڤەنگا خۆ دابوو وێ باڵندەی و ل هیڤیێ بوو خۆ نێزیکی پەنجەرکێ بکەت، دا بکوژیت.

ڤێ جارێ ژی پیچەك مابوو ئەڤ بالندە ببیتە نێچیرا مرۆڤان، هەکە ستێر ب لەز د هاوارا وێ نەهاتبا، کەیفا باڵندەی گەلەك هات دەما جارەکا دی ستێر دیتی و گۆتێ ب ڕاستی ئەز باوەر ناکەم، کۆ مرۆڤ هندە د دلڕەقن و نەخۆشیێ دگەهینە گیانەوەران و دکوژن، هیڤی دکەم ڤێ جارێ من بکە گیانەوەرەکێ دڕندە، دا مرۆڤ ژ من بترسن و خۆ نێزیکی من نەکەن، چونکی من دڤێت د ژیانەکا ئازاد و تەناهی دا بژیم. ڤێ جارێ ژی ستێرێ داخوازیا وێ بجه ئینا و ئەڤ جارە کرە هرچ.





هەر چەندە هرچ گیانەوەرەکا بترسە و مرۆڤ
نەشێن زوی ب زوی خۆ نێزیک بکەن، لەو ژی وێ
ئەڤ داخوازە کربوو، چونکی وێ هزر دکر ب ڤی
رەنگی کەس نەوێریت خۆ نێزیکی وێ بکەت، لێ
دەما هرچێ ڤیای پیچەکێ د ناڤ دارستانێ دا
بگەرییێت، ئێکسەر کەفتە تەلهەکا ئاسنی و
هاتە گرتن.

ب راستی مرۆڤان چ خۆشی بۆ گیانەوەران
نەهێلایە، ژبەرکو گەلەك تەڵهە ل دارستانێ
ڤەشارتبوون و دڤیا گیانەوەران پێ نێچیر بکەن.

ماسیا بچویک هێشتا ل سەر داخوازیێن خۆ یا بەردەوامبوو، چونکی چەند جارەکا کەفتبا نەخۆشیەکێ ئێکسەر دا ستێر د هەوارا وێ هێت، ئەڤ جارە ژی حەز کر ببیتە پشیک، چونکی وێ هزر دکر مرۆڤ گەلەك حەز ژ پشیکان دکەن و نەخۆشیان ناگەهینێ.

دەما بوویە پشیک قەستا مالەکێ کر، دا بچیت دگەل وان بژیت، لێ هێشتا ل بەر دەرگەهی، سەیەکێ گەلەك دڕندە لێ کرە هاوار و هێرش کرێ، پشیک گەلەك ترسیا و ئێکسەر ڕەڤی و خۆ ژ وی جهی دویر کر.





پشتی پشیک چوویە جهەکێ ئارام و تەنا، هزرا خۆ کر و گۆت ئەگەر ئەز بەق بامە، من چ دوژمن نەدبوون و دا ب تەناهی ژیم، هەر ئێکسەر ستێرێ ئەڤ داخوازیا وێژی بجهـ ئینا و کرە بەق. نۆکە بەق یا دناڤ بیستانەکی دا و سترانان بۆ خۆ دبێژیت.

پشتی هینگێ گوهـ ل دەنگێ هندەك بەقێن دی بوو ل لایێ دی یێ رویباری، دەما بەقێ ڤیایی بچیتە دەڤ وان، جادەك کەفتە د رێکا وێ دا و هەوڵ دا دەرباز بیت، لێ ترۆمبێلەك گەلەك بلەز دهات و پیچەك مابوو بەقێ بهێلتە ب ئەردیڤە.

ئەڤێ ماسیا بچویک گەلەك داخوازی دکرن و دەما داخوازیێن وێ بجه دهاتن، ئێکسەر پەشیمان دبوو و هەر زویکا حەز دکر ببیتە گیانەوەرەکێ دی،
پشتی زانی ژیانا بەقان ژی یا د مەترسیێ دا، ئەڤ جارە حەز دکر ببیتە مشک، لێ هێشتا نەبوویە مشک ئێکسەر مارەکی ڕاهێلا ب دیڤە دا کۆ بخۆت.





مشك ب لەز ڕەڤی و چوو د مالەکێڤە، لێ د وێ مالێڤە ژی پشیکەکا دڕندە هەبوو و دەما چاڤێ وێ ب مشکی کەفتی، ئێکسەر ڕاهێلاییێ دا بخۆت، لێ باشبوو ڤێ جارێ شیا خۆ قورتال بکەت.

جارەکا دی ستێر هاتە دەڤ وێ. لێ ڤێ جارێ گەلەك یا ژێ تۆرەبوو و گۆتێ ئەڤە تە گەلەك داخوازی کرن و من هەمی بۆ تە بجهـ ئینان، لێ توو ب چ تشتان رازی نەبووی، لەو ئەز دێ تە زڤرینمەڤە وەك دەستپێکێ و دێ بیە ماسیەکا بچویک، لێ دێ دەرفەتێ دەمە تە بتنێ ئێک داخوازیا دی دێ بۆ تە بجهـ ئینم و خۆ هەکە ژیانا تە چەند بکەڤیتە د مەترسیێ دا، ئەز د هەوارا تە ناهێم، ئانکۆ هەتا هەتایێ دێ مینییە د وی سەرویەری دا.





ستێر ڕازی بوو بتنێ ئێک داخوازییا ماسیا بچویک بجھ بینیت، لێ ب مەرجەکی کۆ بهایێ ڤێ داخوازیێ دێ گەلەك یێ مەزن بیت و ب چ ڕەنگان ڤەگەریان ژێ نینە، کەیفا ماسیا بچویک گەلەك هات و سۆپاسیا ستێرێ کر، ماسیێ گۆت ئەز حەز دکەم تو ڤێ جارێ پیچەکێ دەلیڤێ بدەیە من، هەتا سوباهی ڤی وەختی، چونکی ڤێ جارێ من دڤێت باش هزرێن خۆ بکەم، نەکۆ ژ دەڤخۆ بڕیارەکێ بدەم.

ستێر ل سەر ڤێ پێشنیارا ماسیێ ڕازیبوو، لێ جارەکا دی بیرا وێ ئیناڤە، کۆ دڤێت ڤێ جارێ باش هزرێن خۆ بکەت و مفای ژ سەربۆرێن خۆ یێن بەری نۆکە وەربگریت، داکۆ جارەکا دی پەشیمان نەبیت، چونکی پشتی ئەو داخوازیا وێ یا دووماهیێ بۆ بجهـ دئینیت، ب چ ڕەنگان ڤەگەریان نینە و ئێدی ئەو ستێرێ نابینیتەڤە. پشتی هینگێ ستێرێ دەلیڤە دا ماسیێ و هەتا سوباهی هزرێن خۆ بکەت و پاشی خاترا خۆ ژێ خواست.





پشتی هینگێ ستێر بەرزەبوو و ماسیێ دەست ب
هزرکرنێ کر، کا ئەڤ جارە چ داخوازیێ بکەت،
کۆ ژێ پەشیمان نەبیت، ماسیێ هەر جار هزرا
خۆ د گیانەوەرەکی دا دکر، لێ پشتی هینگێ
بۆ دیار دبوو، کۆ چ گیانەوەر نینن مەترسی ژ
لایێ مرۆڤان یان ژ لایێ گیانەوەرێن دیڤە ل
سەر نەبیت، ماسی ما د ڤان هزران دا هەتا خەوێ
چاڤێن وێ گرتین و نڤستی.
دەما سپێدێ ژ خەو رابووی دیت رۆژ یا هەلاتی و
کچکەکا جوان و شۆخ و شەنگ یا تەماشەی
وێ دکەت.

بڕاستی ئەو کچکەکا گەلەك جوان و نازك و شۆخ و شەنگبوو، پرچا وێ یا زێڕین و چاڤێن وێ یێن شین و دێمێ وێ یێ بگرنژینبوو، ماسی کەیفخۆش دکر، هەر دەما ڤێ کچکا جوان تەماشەی ماسیێ دکر بۆ دگرنژی، لەو ماسیێ ژی بۆ یاری و لڤینێن جوان دکرن،

لێ تشتێ ماسی خەمگین کری ئەوبوو کۆ ئەڤ کچکە نەدشیا بڕێڤە بچیت و یاریان بکەن، چونکی پێ وێ شکەستبوو و ل سەر ئەرەبانکێ یا روینشتیبوو و گەلەك یا دامایبوو.





ژ لایەکیڤە کەیفا ماسیێ هات، دەما ئەڤ کچکا بچویک دیتی، چونکی وێ زانی ئەو نامینتە بتنێ و هەڤالەك بۆ وێ پەیدابوو، لێ د هەمان دەم دا یا خەمگینبوو دەما کچک ب وی شێوەی دیتی کۆ نەشێت برێڤە بچیت، ب تایبەت ژی دەما کچکێ د پەنجەرکێ دا تەماشەی هەڤالێن خۆ دکر یێن بۆ خۆ یاریان دکەن و کەیفێ دبەن، لێ ئەو یا ژ ڤێ چەندێ بێ پارە و نەشێت برێڤە بچیت.

ماسیێ د دلێ خۆ دا دگۆت، بڕاستی ئەڤە کچکەکا گەلەك دامایە، ژبەرکو نەشێت بهێت و بچیت و بچیتە ژ دەرڤە دگەل هەڤالێن خۆ یاریان بکەت، ئەو ب رۆژێ هەمیێ یا د مالڤە و ل سەر کورسیکێ یا روینشتیە، ئەو ژی وەکی من یا هاتییە زیندان کرن و نەشێت ب ئازادی بهێت و بچیت و خۆشیێ بۆ خۆ دروست بکەت.

دگەل ڤان ئاخفتنان بیرا ماسیێ ل ستێرێ هات، کۆ دەلیڤە دابوویێ بۆ خۆ داخوازیەکا دی بکەت، لێ هێشتا وێ بڕیار نەدایە ڤێ جارێ چ داخوازیێ بکەت.





پشتی رۆژ ئاڤابوویی و دونیا بوویە شەڤ، کچکا بچویک چوو سەر جهێن خۆ دا بنڤیت، ستێر ژی ل دووڤ ژڤانێ خۆ یێ دەستنیشان کری هات، هەر وەکی بەری هینگێ وێ سۆزدایی. ستێرێ گۆتە ماسیێ: نۆکە ئەز یا هاتیم، داکۆ داخوازیا تە یا دووماهیێ بجه بینم، هیڤییا من ئەوە ڤێ جارێ تە داخوازیەکا ب مفا و رەوا هەبیت. ماسیێ ب خەمگینیڤە تەماشەی کچکا بچویک کر و تەماشەی ئەرەبانکا وێ کر و پاشی گۆتە ستێرێ: ڤێ جارێ من داخازیەکا جودا ژ جارێن دی یا هەی.

ماسیێ گۆت: ڤێ جارێ من دڤێت ل شوینا تو هاریکاریا من بکەی، توو هاریکاریا کچکا هەیا بچویک بکەی، چونکی من گەلەك هزرێن خۆ کرن و بۆ من دیاربوو کۆ هەر کەسەك ژ مە دڤێت یێ رازی بیت ب وی تشتێ وی هەیی و باوەری ب خۆ هەبیت، لێ دگەل هندێ دڤێت مرۆڤ هاریکاریا کەسێن دی یێن پێدڤی ب هاریکاریێ بکەت، لەو هیڤییا من ئەوە تو هاریکاریا ڤێ کچکێ بکەی، دا کۆ ئەو بشێت برێڤە بچیت.





ب ڤێ داخوازیا ماسیێ کەیفا ستێرێ گەلەك هات و گۆت: ئەی هەڤالا من یا خۆشتڤی، ب راستی ئەڤ داخوازیا تە کری ژ هەمی داخوازیێن تە یێن بەری نۆکە ب بهاتربوو ل دەڤ من، لەو ب سەربلندیڤە ئەز دێ هاریکاریا وێ کەم. پاشی ستێرێ بەرێ خۆ دا کچکا بچویک و ب رۆناهیا خۆ پیێن وێ چاککرن، کۆ ئێدی بشێت بریڤە بچیت.

دەما بوویە سپێدە و کچک ژ خەو هشیاربووی دیت پیێن وێ یێن چاك بوین و دشێت پێ بڕێڤە بچیت، کەیفا وێ گەلەك هات و قەت باوەر نەدکر، کۆ ئەڤە پیێن وێنە و ئەو دشێت جارەکا دی یاریان بکەت، کچکێ ب دلەکێ پری کەیف و خۆشی گازی دایک و بابێن خۆ کر، دا کۆ ڤێ مزگینیێ بدەتە وان. دەما ماسیێ دیتی ئەڤ کچکە گەلەك یا کەیفخۆشە کەیفا وێ ژی گەلەك هات.





هەرچەندە ماسیا بچویک دشیا داخواز ژ ستێرێ بکەت، کۆ وێ ب ڤەگەرینتە دەریایی یان جهەکێ مەزن و بەرفرەهـ بۆ وێ دابین بکەت، لێ وێ قوربانی ب ڤێ هیڤیا خۆ دا ژ پێخەمەت هندێ کچکا چاڤشین بشێت جارەکا دی برێڤە بچیت و یاریان دگەل هەڤالێن خۆ بکەت.

ماسی هەر ما د وێ شویشا بچویکدا و د وێ ژوورا تاریڤە، لێ هەر دەما وێ ئەو کچک دیتی یا یاریان دکەت و گەلەك یا دلشادە، وێ نەخۆشیێن خۆ ژی ژ بیردکرن و قەت یا پەشیمان نەبوو ل سەر داخوازا خۆ یا دووماهیێ.